

# نامەی دایکێکی دڵسۆز بۆ کچەکەی

بسم الله الرحمن الرحيم


## ناسنامەی کتێب

ناوی پەرتووک: نامەی دایکێکی دڵسۆز بۆ کچەکەی

نووسینی: عبدالله خاکی

پێداچوونەوەی: مامۆستا ڕەنج شێخانی

نەخشەسازیی بەرگ: عوسمان محمد

نەخشەسازیی ناوەوە: عبدالله خاکی

نۆرە و ساڵی چاپ: یەکەم، ١٤٤٣ کۆچی ٢٠٢١ میلادی

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە «»ی ساڵی «٢٠٢١»ی پێ دراوە.

# پێشكەشە

- بە دایك و باوكی ئەزیزم كە بوونە چراو ڕووناكی ژیانم.
- بە سەرجەم ئەو دایكانەی خەمی پەروەردەكاری كچەكانیان پیری كردوون.
- بە سەرجەم ئەو كچانەی خزمەتكار و گوێداری دایكیانن.
- بەو دایك و كچانەی لەم سەردەمەی نەمانی شەرم و حەیا بوونەتە نموونە لە تەقوا و جلی شەرم و حەیایان پۆشیوە.
- بە سەرجەم ئەو كچانەی ڕێگای دایكمان عائیشە و فاتیمە و ئاسیا ئەگرنە بەر.
- بە سەرجەم ڕۆلە و نەوەكانی ئەم ئیسلامە لە هەر كوێیەك بن.
- بەوانەی بۆ جارێكیش بێ ناویان لە نزا و دوعاكانیان هێناوم.



# پێشەکی ماموستا: ڕەنج شێخانی

پاش سپاس و ستایش بۆ خودای پاک و بەرز و بێهاوتا، سەڵات و سەلامی خودای گەورە لەسەر پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ و یار و یاوەرانی تا ڕۆژی دوایی.

سوپاس و ستایش الله تعالی دەکەم کە ئەم دەرفەتەی زێرینەی بۆ کاکە عبدلله خاکی ڕەخساند بۆ جارێکی تر بە نووسینە جوانەکانیان ئامۆژگاری برا و خوشکانی بکات، ئەمجارەیان ئامۆژگاری تایبەت بە ئافرەتان و خوشکانی بەڕێزەوە، هیوادارم هەموو دایکێکی بەڕێز ئەم ئامۆژگارەیە کورت و پوختە بۆ کچەکانی بخوێنێتەوە هەتا سوودمەند بێت و ببێتە چرا و نور و ڕووناکیەک بۆ دونیا و ئاخیرەتیان لە بەهەشتیش پێکەوە کۆببنەوە خوای گەورە پاداشتی خێرت باتەوە نموونەت زیاد بێت کاکە عبدالله خاکی.

**ڕەنج شێخانی/ سێ شەمە / ٣/٨/٢٠٢١**

# پێشەکی

الحمدلله رب العالمین، الذي أمر ببر الوالدین، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شریك له، وأشهد أن سیدنا ونبینا محمداً عبده ورسوله، إمام المرسلین، وسید الأولین والآخرین، صلی الله علیه وعلی آله وصحبه البررة الأخیار، وسلم تسلیماً کثیراً.

ئەم نامیلکەی بەر دەستتان ئامۆژگاریەکی دڵسۆزانەیە بۆ هەموو دایکان و باوکان و بەتایبەتریش دایکان کە لە کچەکانیان نزیکترن کە چۆن بتوانن ئامۆژگاریان بکەن لەوەی ڕێگای چاکە بگرنە بەر و دووربن لە ڕێگای گومڕای، بۆیە ئەو نامەیەمان تایبەت کرد بە کچان، چونکە هەر کچانن لەم ڕۆژگارەی فیتنە دەبنە قوربانی سەرەکی و یاری بەهەستیان دەکرێ، بۆیە ئەگەر لە زوویەوە پەروەردە نەکرێن و گرنگیان پێ نەدرێ، دوارۆژی ڕەش و ناخۆش بەشیان دەبێت.

ئینجا بۆ ئەوەی ئامۆژگاری کەسێ بکەی وا باشە نامە و دیاری بۆ بنێری بۆ ئەوەی لای تۆ هەست بە گرنگی خۆی بکات،

بۆیە زیاتر بەرەو ڕووی ئامۆژگاریەکانت دێ و سوودی دەبێ، ئەگەر کەسێك هەیە دوور لە ئیسلامە یان لەگەڵت خراپە و پەیوەندیتان سارد و سر و ناخۆشە ئینجا پیاوەکەتە، یان هاوسەرەکەتە، منداڵەکەتە، براکەتە، هاوڕێکەتە، دەتوانی بە لێزانین و حیکمەتەوە نامەیەکی جوان و پڕ لە ووتەی شیرین و ئامۆژگاری بۆ بنێری بە ئیزنی الله تعالی سوودی دەبێت، پێشینە چاکەکانمان سەلەفی سالح (ڕەحمەتی الله تعالی لێبێت) بۆ بیرهێنانەوەی یەکتر و هاندان بۆ ڕێگای چاکە و دوور کەوتنەوە لە خراپە، نامە و پەیام ئامۆژگاری بەسوود و وریاکەرەوە بۆ ڕۆژی دوایی هەبووە.

عبدالرحمن کوڕی مطرف دەڵێت: حەسەن کوڕی حيي ئەگەر بیویستبایە ئامۆژگاری برایەکی بکاتن ئەوا لە پارچە تەختەیەک بۆی دەنووسی و پاشان پێی ئەدا.

**(قَالَ عَبْدِ الرَّحمن بنِ مُطَرِّف: كَانَ الحَسَنُ بنُ حيي إِذَا أَرَادَ أَنْ ينصح أخا له، كَتبَ فِي أَلوَاحِه، ثُمَّ نَاوَلَهُ)[1].**

بۆیە نامە نووسین و ناردنی بۆ کەسی بەرامبەر کاریگەری زۆری دەبێ ئەگەر بە جوانی و زمان شیرینیەوە لە دڵ و دەروونێکی پاکەوە هەلقولا بێت، ئینجا ئەو نامەی ئێمە نووسیومانە بۆ کچێکە لە پێناو بەختەوەری و ئاسوودەی و نەبوونە قوربانی ئەم ڕۆژگارەی پڕی فیتنە و دوور کەوتنەوەی خەڵکی لە ئیسلام و نەمانی شەرم و حەیا و بە کالاکردنی ئافرەت و یاری پێکردن بە هەستیان و ڕووچوون بەرەو دونیا و هەڵاو بەزم و بێئاگای لە مردن و گەڕانەوە بۆ قیامەت، ئینجا ئەو دایکە دڵسۆزە لە

---

[1] - بڕوانە: الجامع لشعب الإيمان - برقم ٧٢٣٦

خەمی بە دەستهێنانی ڕەزامەندی الله تعالی پشت لە دونیا و خۆشیەکانی دەکات و دەست دەکاتە پەروەردەکردنی کچەکەی و دڵیان لە کانیاوی ئیمان بە تەوحید ئاو ئەدەن تا لە کەشتی کاروانی چوون بەرەو بەهەشت دانەبڕێن. بۆیە هیوادارم ئەم کورتە ئامۆژگاریەم سوودی هەبێ بۆ دایکانمان کە بتوانن ئەم پەیامە بدەن بە گوێی کچەکانیان و تا هەر یەك لەوان هەر لە دونیا ببەنە ئەهلی دوارۆژ. داواکارم لە اللهی خاوەن عەرش ئەم ماندووبوونەی چێشتوومانە لە نووسینی ئەم پەیامە و تەواوی کردەوەکانمان لێ قەبووڵ بکات، کە تەنیا بۆ ڕەزامەندیی خۆی بێت، هیچ ماندووبوون و کارێکمان بۆ جگە لەو نەبێت، و بەردەوامیمان پێ ببەخشێ لەسەر ڕێبازی پیرۆزی تەوحید.

**اللَّهُمْ اجْعَلْ عَمَلِي كُلَّهُ صَالِحاً وَاجْعَلْهُ لِوَجْهِك خَالِصَاً وَلا تَجْعَلْ لِأَحَدٍ فِيهِ شَيْئَاً**

**عبدالله خاکی/ ڕۆژی دووشەممە ٢٠٢١/٨/٢**

# نامەی دایکێکی دڵسۆز بۆ کچەکەی

بۆ گوڵی خۆم ،کچە ژیرەکەم...

هیوادارم ئەم ئامۆژگارییە بە گوێی دڵ بخوێنیتەوە کە لەلایەن دایک کە دڵسۆزترین کەستە بۆت نوسراوە لە پێناو بەختەوەری و خۆشبەختی تۆ ئەی کچە ژیرەکەم، کە دەبینم لەچ ڕۆژگارێکی پڕ لە فیتنە و ناخۆشی داینە، هیچ ڕۆژ نیە هەواڵی ناخۆشی و کوشتن بوونە قوربانی ئافرەتێك نەبیستین بۆیە لە خەمی تۆ کچە شیرینەکەم تاوەکو بەسەربەرزی بژیت خەو و خواردن و ئیسراحەتم لێ بوو بە ئارەق و لەخەمی تۆ ئەی کچەکەم هەناوی لێ سووتاندم، لە ترسی نەمان و مەرگ و مردنم وویستم زوو قسەکانی ناخم بۆت بکەم بە نامە و بە دیاری بۆت بنێرم، چۆن من دایکی تۆم و تۆش جەرگ و سکی منیت، ئازار دەکێشم بە ئازارەکانت و دڵخۆش دەبم بە

دڵخۆشیەکانی تۆ، لە پاش نەمانم لە ژیان، کەسی تر نیە بە شێوەی من خەمخۆر و دڵسۆزت بێ کچە جوانەکەم.
بۆیە داوا دەکەم ئەم نامەیەم زۆر بە ووردی و جوانی بە تێگەیشتنەوە بخوێنیتەوە و سوودی لێ وەرگریت، چونکە ئەترسم ژیان فرسەتم نەدا، بەردەوام لە خزمەتت بم و ئاگاداری ناخ و هەست و خەمەکانت بم و مردن لە یەکمان جیا بکاتەوە، بۆیە پێم خۆشبوو بە زووی نامەکە بگاتە دەستت و تا لە ژیانم سەرکەوتن و بەختەوەرییەکانت ببینم کە پابەند بوونتە بە ئیسلام و ئیمان کچە وردیلەکەم.
هیوادارم ئەم نامەیەم بپارێزیت تاکو دوای مردنیشم بۆت بمێنێت و پێویستت بە کەس نەبێت و هەست بکەی کە بەردەوام من لاتم.
کچە ژیرەکەم، بیزانە بە قوربان ئێمە بۆ ڕابواردن و خۆشی و گەڕان و پاڵدانەوە نەهاتووینەتە ئەم ژیانەی دونیا، هەتا هەتا

بە نەمری تێیدا بمێنینەوە هەر خەریکی ڕابواردن و خۆشی و هەڵاو بەزم بین، بەیانی بە دڵخۆشی هەستینەوە وەکو ڕۆژانی ڕابردوو، گشت کاتەکانمان لە سەفرە و سیاحە و گەڕان و سووڕان بەسەر ببەین، بیزانە ئەگەر وابا کە نەمرین و ئەم ژیانی دونیا هەمیشەیی و بێ کۆتا بوایە.

ئەی بۆچی تێنومان دەبێت و گەرومان ووشك ئەبێت؟!

بۆچی گەر ڕۆژێك خواردن نەبێت برسیمان دەبێ و لاواز دەبین؟!

بۆچی خەم و ئازار دەچێژین و بێزار دەبین؟!

بۆچی ماندوو دەبین و نەخۆش دەکەوین؟!

بۆچی ئازیز و خۆشەویستان جێمان دێڵن و لەپێش چاوانمان وون ئەبن بۆ هەمیشە!

بۆچی لە هەژاری و نەبوونی ئەترسێن و ڕۆژێك نەبون بین وا ئەزانین کۆتا ڕۆژی ژیانمانە؟!

بۆچی و سەد بۆچی ...

کچەکەم ئیتر ئەمە حەقیقەت و ڕاستی ئەم دونیاییە کە ژیانێکی زۆر کەمەو دەبێت هەموومان بمرین و بگەڕێنەوە بۆ لای الله تعالی.

**(أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَٰكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ)**[١] واتە: ئایا گومانتان وادەبرد کە بە ڕاستی ئێمە ئێوەمان بە بێ مەبەست دروست کردووە هەر لە دونیا دەمێننەوە و ئێوە بۆ لای ئێمە ناهێنرێنەوە؟!

بۆیە بیزانە کچە جوانەکەم، حالی بووین و زانیمان ئێمە بۆ تاقیکردنەوە هاتووینە ژیانی دونیا تاوەکو الله تعالی هەر یەك لە مرۆڤەکان بەپێ کارو کردەوەکانی هەلبسەنگێنێت.

---

١- سورەتی المومینون ئایەتی: ١١٥،

(لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا)[1] واتە: بۆ ئەوەی تاقیتان بکاتەوە کە کێتان باشترین کردەوە ئەنجام دەدات.

چۆن لە پرۆسەی خوێندن تاقیکردنەوە دەکەین ئەگەر سەرکەوتوبووین دەچینە قۆناغی باشتر، ئینجا مامۆستا وانەکان دیاری دەکات، چی بخوێنن و چی نەکەن تاکو ڕۆژی تاقیکردنەوە نمرەی بەرز بەدەست بێنن بۆیە الله تعالى (ولله المثلى الاعلى) هەروەک قوتابخانە تاقیمان دەکاتەوە، لە قورئان و سوننەتی رسول الله ﷺ ڕێگای خراپە و چاکەی بۆ دیاری کردووینە، سنووری بۆ داناوین ئەمە خراپە و حەرامە مەیکە وە ئەمەش چاکەیە بیکە، ئەگەر فەرمانی جێبەجێ بکەین بە بەهەشت پاداشتمان دەداتەوە.

ئەگەر بەگوێی نەکەین جەهەنەم و دۆزەخ دەکاتە شوێنمان پەنا بە الله تعالى.

---

١- سورەتی الملک ئایەتی : ٢

ئینجا کچە ئاقڵەکەم لە بەهەشت خەم و خەفەت نیە ماندوبوون نیە، دابڕان و دڵ شکانی یەکترە نیە، پیری نیە، چلکنی و دڕانی جل و بەرگ نیە، تەنها خۆشی و گەڕان و سووڕانە لەو بەهەشتە هەرچی دڵ حەزی لێیە هەیە هەتا هەتا واتە تا ئەبەدی تێدا دەمێنینەوە.

**(عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنْ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ يَنْعَمُ لَا يَبْأَسُ، لَا تَبْلَى ثِيَابُهُ وَلَا يَفْنَى شَبَابُهُ)[1]**

واتە: ئەبو هورەیرە (خوای تعالی لێ ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس بچێتە بەهەشتە وە هەمیشە بەهرەمەند دەبێت و ناخۆشی بەسەردا نایەت، نە جلوبەرگی کۆت و داڕزاو دەبێت و نە تافی لاویشی بەسەر دە چێت.

---

١ - صحيح مسلم.

بۆیە بیزانە کچەکەی خۆم پاداشتی نازو نیعمەتی ئەم بەهەشتە لە بری ماندوبوون و هیلاکیت بەهاوین سەر پۆشەکەت لەسەر ئەکرد، هەموو ڕۆژ قورئانت ئەخوێند و لە ڕەمەزان بە ڕۆژوو بوویت، لە نوێژەکانت گەرم و گوڕ بوویت، یەکێك بووی لە ئەهلی تەوحید بۆیە خوای تعالی لە بەرامبەر پابەندبوونت بە فەرمانی دەتخاتە بەهەشتەکەیەوە، تاوەکو بە یەکجاری بحەسێینەوە.

چونکە خۆت دەزانیت کچەکەم لەم دونیایەی پڕ لە ناخۆشی و تاقیکردنەوە سەختانە هیچ ئیسراحەت و خۆشیەکی وا نیە تامی لێ بکەین، سەیر بکە چەند ماندوو دەبین بە ماڵەوە قاپ دەشۆین، خواردن دروست دەکەین، ماڵ پاك ئەکەینەوە، جل ئەشۆین، زۆر ماندو دەبین ڕۆژانە بێزار دەبین، نازانین چ خواردنێک دروست بکەین، گشت ڕۆژەکانمان دووبارەن، بەیانی نان دەخۆین، خەمی ئامادەکردنی نانی نیوەڕۆمانە چی

دروست بکەین، نیوەڕۆ دەخۆین خەمی ئێوارەمانە نازانین چ دروست بکەین، بۆیە کچە جوانەکەم بیربکەوە بزانە چەند ماندو و هیلاك دەبین بەماڵ کوا خۆشی و ئیسراحەت لەم دونیا تۆ بیربکەوە ئەگەر بچیتە دەوام هەموو ڕۆژ خەمی دەوامەکەتە، دەبێ بەیانی زوو هەستیتەوە لەخەوی خۆش بۆ زانکۆکەت بەسەرماو گەرما، بۆیە ژیانی دونیا هەموو ماندوبوونە.

بۆیە توخوا کزەی جەرگم، کچەکەم با ئەو بەهەشتە نەبڕاوەی قیامەت لە پێناو خۆشیەکی کەمی کاتی دونیا لەدەست نەدەین با گوێداری فەرمانی اللهبین با خەممان نوێژەکانمان بێت لە کاتی خۆی زوو بکەین، خەممان ئەوە بێ ڕۆژێك کەمتەرخەم بین لە عیبادەت و هەوڵبدەین بەردەوام گەرمو گوربین لە پەرستنی.

کچە شیرنەکەم، بیر لە ناخۆشی ئاگر و گەرمی و سەختیەکانی دواڕۆژ بکەوە، ئێمە لە دونیا زۆر جار لەبەر گەرمی و ماندویەتی بێزار و بێتاقەت دەبین، بۆ نموونە: ڕۆژێکی چلەی هاوین نەخۆشی و ئەچیتە نەخۆشخانە و لە چاوەڕوانی دکتۆر خەڵکێکی زۆر لە پێش تۆ وەستاون، ئارەق هەموو گیانی پۆشیوی لەوانەیە بەهۆی ناخۆشی و بێزاری و گەرمی ئەو ڕۆژە لە هۆش خۆت بچیت و ئاوات بە مردن بخوازی ئەوەندە بێزاری، ئەی دەبێت ئاگری جەهەنەم چەندە ناخۆش و گەرم بێت، کچە ئاقڵەکەم سەیر بکە ئافرەتانی پێشین چەندە لە ئاگری دۆزەخ ترساون.

ڕیباحی کوڕی جەراح دەڵێت: ئامینەی کچی موریع لەو کەسانە بوو کە زۆر دەترسا لە ئاگری جەهەنەم و هەر کاتێک باسی ئاگری جەهەنەم و دانیشتووانی بکرایە، دەستی دەکرد بە گریان و خەڵکەکەشی دەکردە گریان و دەیفەرموو: دەخرێتە

ناو ئاگرەوە، و خواردنیان ئاگرە خواردنەوەیان ئاگرە و ژیانیان لە ناو ئاگردایە، پاشان دەستی دەکردەوە بە گریان.

**(قال رباح بن الجراح الموصلی: کانت امنه بنت المورع من الخائفین وکانت انا ذکرت النار واهل النار بکت وابکت وقالت: ادخلوا النار، واکلوا من النار، وشربوامن النار، وعاشوا فی النارثم تبکی)[1].**

بیزانە کچە شرینەکەم نموونەی ئافرەتی لە الله ترس ئاوا بوونە، بەردەوام گریاون و خۆیان پاراستووە لە بێ فەرمانی و سنور بەزاندنی الله، لەترسی ئاگر و ناخۆشیەکانی، بۆیە کچی خۆم تۆ ئەم ئافرەتە ژیر و لە اللهترسانە بکە پێشەنگت، نەك کچە ئەکتەر و گۆرانیبێژە جاهیل و کچە بێڕەوشتەکان و کچە سفورەکانی زانکۆ پێیان هەلبخەلەتێت.

[1] - بڕوانە: الجامع لشعب الایمان (٥٤٥/٢)

بۆیە تا لە ژیانین فرسەتە کچەکەم با بگەڕێینەوە و بۆ گوێڕایەڵی الله تا بەهەشت بکاتە پاداشتمان.
کچە جوانەکەم بەهیچ شێوەیەک بەگوێی هاوڕێی خراپ و کچە خزمەکانمان مەکە کە پێت بڵێن خۆت جوان بکە دەی دەی چەندە جوانی برۆت باریک بکە جلی تەسک بکە بەرت وای ماشاءالله چەند جوانی بەو جلانە وات لێ بکەن گوێداریان بیت توخوا گوێداری هیچ کەس نەبیت لە خراپە و دوور خستنەوەت لە ڕێگای خوای تعالی، بۆیە هیچ کات بە گوێیان مەکە لە دوور خستنەوەت لە ڕێبازی ئیسلام یان دەچیتە لایان هەموویان باسی دەزگیران و کەپلی خۆیانت بۆت دەکەن و بڵێن تۆش کەپڵت هەیە و باسی دونیا و جل و قاپ و قاچاغ، فلان فیلم و ئەکتەر تۆ بێدەنگ بە و لە دڵی خۆت یادی الله بکە زیکری بکە (استغفرالله، الحمدلله، لااله الاالله)، هەرچی زیکر

دەزانی بیکە مەهێلە کاتە بە نرخەکانی تەمەنت بەشتی بێسوود بە فیرۆ بڕوات.

تۆ گاڵتەت بەقسەکانیان بێت بەالله کچەکەم ئەگەر تۆ پاک و ڕاستگۆبیت لەگەڵ الله دڵنیابە دڵت ئارام و ئاسوودە دەکات و ژیانێکی خۆشت لە دونیا پێدەبەخشێ و باشترین گەنج دەکاتە قسمەتت، بۆیە خەمت ئەوە نەبێ کە تۆ شووت نەکردوە هاوڕێ و خزمانت شوویان کردووە، تۆ خەمت بەدەستهێنانی ڕەزامەندی الله بێت واللە ئەوکاتە الله ڕەحمەت و میهرەبانی خۆی بەسەرتدا دەبارێنێت، و گەنجێکی چاک و سولحاوت پێ دەبەخشێت بە هەرچی شتی دونیایە نەتگۆڕێتەوە.

کچی خۆم جەرگ و هەناسەی من بیل بیلەی چاوم دەمەوێت بت پارێزم لەو گورگانەی حەزیان بە گۆشتی لاشەتە پاش تێربوونیان ئیسقانت فڕێ دەدەن و دەچن بەدوای گۆشتی چەورتر..

ئەزیزەکەم حەزەکەم پێت بڵێم تۆ خونچە گوڵی زۆر کەس دەیەوێ هەڵتوەرێنێ نابێ بە هیچ دەست و چەپۆک و بایەک بشکێی و جیات بکەنەوە لە قەدەکەت کە حەیاو شەرمی تۆیە!

گوڵی دایە دەمەوێت فێرت بکەم شەرەفی خۆت بپارێزی نەک ئێمە ببینە پاسەوانی لەسەر تۆ ئەرکە بیپارێزی لەسەر ئێمەش ئەرک و واجبە فێرت بکەین و ڕێگای چاکەت پێ نیشان بدەین..

کچی نازدارم بە هەموو ڕێگایەک دامەڕۆ زۆر ڕێگا هەیە بەرەو هەڵەدێرت دەبات خۆت ڕێگایەک دروست بکە بە دەست گرتن و شوێنکەوتنی قورئان و سوننەت تا بەرەو بەهەشت بتبات، من لە تۆ زیاتر دونیام دیوە و ئەزموونم زیاترە هیچ شتێکم نەدیوە بەقەدەر شەرم و حەیا ئافرەت گەورە بکات شتێکم نەدیوە باشتر و پارێزەرتر بێت لە مانەوە لە ماڵ بۆ ئافرەت، دەمەوێت لە بەهەشت لەگەڵ من بیت بۆیە ژیانی دونیا واز لێبێنە،

بۆ قیامەت بژی ئێمە خەڵکی ئێرەنین خەڵکی قیامەتین، ڕۆژێك بە ناچاری ژیانی دونیا بەجێ دێڵین!

ئینجا کچەکەم بیزانە تەنها کوڕێک دەتوانێت ژیانت خۆش بکات کە لە الله ترسبێت ئەوکات زووڵمت لێناکات و خۆشی دەوێیت و ڕێزت دەگرێت واللە دڵی دایە کوڕی جوان و دەوڵەمەند ئەگەر ديندار و ڕەوشت جوان نەبێت ژیانت دەکاتە دۆزەخ تەنها بۆ خۆشی خۆی تۆی دەوێت واتە هەرشت ئەو دڵی خۆش بکات بۆ خۆی دەیکات خیانەت و ناپاکیت لێدەکات چونکە لە الله ناترسێت بۆیە تکایە کچەکەم تەنها بیر لەوە بکەوە گەنجی ديندار و ڕەوشت جوان ببێتە هاوسەر و هاوخەم و ڕێبواری ژیانی دونیا و دوارۆژت.

جەرگی من چاوت لەخۆت بێت، هەر کوڕێک داوای پەیوەندی لێکردی پێی هەڵمەخەڵەتێ هەرشتێک بوو پرس بەدایکی خۆت بکە قوربانت بم کچەکەم واللە خۆشی تۆم دەوێیت لە خۆت

زیاتر بۆ خۆت، بۆیە نامەویٚ ژیانی جەرگ و سکم بفەوتێت و لە ناخۆشی بیت کەوایە هەمووکات گوێدارم بە من دایکی تۆم تۆش کچ و دڵخۆشی و ڕووناکیماڵەکەمانی و هەناسەی منی.

بۆیە کچەکەم تا لەژیانم گوێدارم بە دواتر دونیایە هەموومان دەمرین، ئینجا کە مردم ئەوکاتە قەدرم دەزانی!

چەندە دڵخۆشی و ئازیزی تۆبووم و دەگریت دەلێی خۆزگە لە ژیانم مابا خۆزگە گوێداری دایکم بام، خۆزگە فلانە کارەم بە گوێی کردبا، بۆیە کچە ژیرەکەم تاوەکو لە ژیانم گوێدارمبە چونکە سوێند بەخوا خۆشی تۆم ئەوێت پێش خۆشی خۆم، بابۆ الله بژین، با بەڵێن و پەیمانی پێ بدەین لێدانی گشت ترپەی دڵمان حەرام بکەین بۆ غەیری ئەو بێت..

گوڵی خۆم، کچەکەم هەوڵبدە نەهێلیت کاتەکانت بەفیرۆ بچێت لە کاری بێسوود و سەیرکردنی فیلمی بەدڕەوشت و

دۆبلاژکراوەکان وەکو خەڵکی تۆ وامەبە کە تەنها مەبەستیان بێ ئەخلاقکردنی کوڕ و کچانە.

بۆیە هەوڵدە کاتەکانت لە کردنی کاری چاک و بەسوود بۆ دونیاو قیامەتت ببە سەر تا لە دونیا بەختەوەر بژین و لە دوارۆژیش بەهەشت جێگامان بێت.

خۆت فێری دین و بەرنامە پاکەکەی ئیسلام بکە توخوا کچەکەم وەسیەت بێ دوای مردنم قورئان بکە هاوڕێت و هەوڵبدە ڕۆژانە قورئان بخوێنەو ڕۆژی یەک ئایەت بێ بەس دامەبرە لە خوێندنی قورئان و کتێبی بەسوود و فەرموودە شیرینەکانی پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ بخوێنەوە، دڵت پەیوەست بکە بە ئیسلامەوە، دوای مردنم تەنها ئیسلامە دڵسۆز و ڕێنیشادەر بۆتۆ، کەوایە دەستی پێوە بگرە.

کچی خۆم ئەم ووتانەی دایکت لە مێشکت بهێڵەوە ڕۆژانە بیری خۆت بخەوە بزانە ئەم ئامۆژگاریەم چەند لە پێناو بەختەوەری

تۆ بووە، و تەنها ئاواتم لە دونیا دڵخۆشی تۆ بووە، تۆ جەرگ و هەناسەی منی پێم خۆش بووە بەختەوەرتر بژی لە من، کە تەمەنت تێپەڕی و گەورە بوویت ئەو کاتە ڕاستی قسەکانمت بۆ دەر ئەکەوێت.

ئەی ڕۆژێك لە ڕۆژان تۆ بیری مردنت کردۆتەوە کچەکەم کە دەبێت بمرین و ئەم ژیانە کەمە و کاتیەی دونیا بەجێ بێلین مردنیش زۆر بێ ڕەحمە، سۆز و بەزەیی بە هیچ کەس ناکات بەس خوای تعالی فەرمان بکات فلانە کەس گیانی بکێشە، یەکسەر لە چاوتروکانێك ڕووحی دەبات لەگەڵ خۆی، ناڵێت گوناهە پێنج منداڵی لەدوا جێ دەمێنێت با منداڵی یەتیم نەبن، نەخێر ڕەحم ناکات یەکسەر گیانمان دەکێشێت، ئینجا لەژێر قەبر مەترێك جێگامان دەبێت تەنێک خوڵ و بلۆک دەیکەنە سەر لاشەمان، تەنگ و تەسك و تاریك.

تاریکترت و ڕەشتر لە هەموو ڕەشیەك نە گڵۆپی لێیە نە خواردن نە سیسەم، دەبینە خۆراکی کرم و مار و حەشەراتی ژێر گۆر، ئا ئێستا بە ئارەزووی خۆمان دەسووڕێنەوە پیاسەو سەیران و خۆشی دەکەین بەڵام لە ژێر گۆر دە بست شوێنمانە.

بۆیە کچەکەم با لەم دونیایە تاکە خەممان ڕەزامەندی خوای تعالی بێت نوێژێ تاخیر دەکەین ڕۆژێ قورئان نەخوێنین خەم و ئازار دامان بگرێ نەک خەمی ئەوەمان بێ کچان لە بازار جلی جوان و سەرنج ڕاکێش لەبەر بکەن ئێمەش چاویان لێ بکەین دڵنیابە ئەوان لەخەوی بێئاگای بێ هۆش کەوتوونە، دڵ و چاو و تەواوی هەستەکانیان لە دەست داوە، ئەگەر ڕاستی ژیانی دونیا حالی ببان گریان دەبوویە کاری ڕۆژانەیان.

لە کۆتایی ئامۆژگاریەکانم نموونەیەکت بۆ دەهێنمەوە، کچە ژیرەکەم، ئەگەر بێت و ڕۆژێك مامۆستا لە قوتابخانە بڵێت ئەم لاپەڕە واجبە و هەمووی لەبەر بکەن سەد لە سەد نمرەی بەرز

دەهێنن، ئەگەر تۆ فەرمانی مامۆستات ئیهمال کرد، ئەوکاتە ساقیت دەبیت و دەرناچی و نمرەی بەرزت پێ نادات، دەڵێت تۆ بەجوانی بەگوێت نەکردم، بۆیە کاتێك تۆ ئیهمال بووی نیوەی لاپەڕت خوێندبوو ئەوجا خەم دەخۆی، بەخۆت دەلێی لاپەڕێک چیە خۆزگە هەمووم لەبەر دەکرد ئینجا خوای تعالی (پاک و بێگەردی بۆ الله) بەهەمان شێوە دەڵێ ئەی ئافرەتان خۆتان بەجوانی باڵاپۆش بکەن سنوری شەرع مەبەزێنن من ئەتان بەمە بەهەشت، بۆیە نابێت کەمتەرخەمبی دەبێت جوامێرانە و بێ لێبڕان فەرمانی الله تعالی بەجوانی جێبەجێ بکەین تاوەکو بە باشترین شێوە پاداشت بدرێینەوە.

بۆیەش کچە جوانەکەم هەوڵدە ڕەوشت و هەڵسوکەوتت جوان بکە با هەموو خەڵك پێت سەرسام بن و بەردەوام باسی شەرم و حەیا و ژیریت بکەن، ئۆۆ ماشاءالله کچی فلان چەند تەقوایە چەند بە ئەدەبە چەند بە شەرمە چەن بێدەنگە

هەموو حەسوودی بە جەرگی دایە ببەن پێم خۆشە ئاوابیت و بەم شێوەیە تاکو الله تعالی سەربەرزت بکات لە دونیاو دوارۆژ، کەوایە هەوڵدە لە ژیانت تاکە ئامانج و خەمی سەرەکیت ئەوە بێت کە بۆ الله بژی و لێدانی گشت ترپەی دڵ و گشت جولانەوەیەکت بۆ ئەوبێت تا لەدونیا بەختەوەر و بە **شادی** بژی و لە دوارۆژیش بەهەشتی فیردەوس شوێنمان بێت.

بەاللەی خاوەن عەرشت ئەسپێرم کچە شیرنەکەم....

جەرگ و دڵی خۆم.. دڵسۆزی دونیا و دوارۆژت دایکی خۆت ....

بەندە و خزمەتکاری ئیسلام: عبدالله خاکی

بۆ پەیوەندی و ناردنی سەرنج و تێبینیەکانتان لە فەیسبوك و تێلگرام:

عبدالله خاکی

عبدالله خاکی